# ئیمانی قبوڵبوو لای الله کـــامـــەیــــە ؟!

نـوسینـی: ابـــو ســیـــوف



# پێشەکی:

بسم الله الرحمن الرحيم

**إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوله اما بعد....**

ئێمە لە ژیانمانا زۆر گوێمان لە وشەی "باوەڕ" دەبێت نموونە دوو کەسن دانەیەکیان بەوی تر دەڵێت "من باوەڕم پێت نییە" ئا لێرەدا واتا کەسەکە بەڕاست دانانێت لە دڵ و مێشک و مزری خۆیدا کە هەر وەک چۆن لە دڵەوە باوەڕی پێی نییە بە هەمان شێوە بە زاریش وای وت وە لەوە دڵنیاین کە بە کردەوەش ئامانەتی لەلا دانانێت بۆ؟ چونکە وتی باوەڕم پێت نییە کەواتە چۆن کردەوەیەک بەرامبەری دەکات و خۆی دەدات بە دەستی ئەو؟ بێ گومان ناچێتە ئەقلەوە کە نە لە کاتی تەنگانە نە لە کاتی شێنەیی پشت بەو کەسە ببەستێت ماوار بۆ ئەو کابرایە

ببات کە باوەڕی پێی نییە دەی ئەگەر وا نەبوو هاتوو لە دڵەوە باوەڕی بە کابرا نەبوو بەڵام بە زمان وتی باوەڕم پێتە لێرە درۆی لەگەڵ کردووە و کابرایەکی دووڕووە!! لە ڕووی کردەوەشەوە سستە هەرچەندە بانگەشەی باوەڕ بکات پێی بەڵام مادام لە دڵەوە باوەڕی پێی نییە لە کردەوە سستە بەرامبەری ئەگەر نمونە لەمانگێکدا پێنج جار بچێتە ماڵی کەسێک کەباوەڕی پێیەتی لەدڵەوەش بەڵام لەساڵێک یەک جار دەچێتە ماڵێ ئەوکەسەیان کە لەدڵەوە باوەڕی پێ نییە بەڵام بەدەم سەلماندۆتی کە باوەڕی پێیە و لەبەر قسەکەی ساڵێ جارێکیش بێت هەر ئەچێت بۆلای، ئا ئەمەش سیفەتی دوڕووانە لە ژینی دونیا و دینی الله شدا، کە وتمان ئەو سستیە زۆر جیاوازترە لە کەسێک کە باوەڕی پێییەتی کە بە دڵ خۆشی دەوێت و بە زمان پێی دەڵێت بە کردەوەش بەرەو ئەو ئەرِوات بەگرِوتینەوە..

جا هەتا ئێرە زانیمان کە ئیمان(باوەڕبون) لە زمانەوەنیدا بریتییە لە:

(التصدیق بالقلب -اقراربالسان -وعمل بالجوارح )

واتە: (بەڕاست دانان بە دڵ-چەسپاندنی بە زمان -کارپێکردنی بە ئەندامەکان)

کە بەڵێ چەندین بەڵگەی شەرعیشمان هەیە کە دەیسەلمێنێت ئەو ئیمانەی کە الله تعالى لە ئێمەی دەوێت بۆ ئاینەکەی هەمان ئەو ئیمانەیە کە دەبێت بە( دڵ باوەڕی پێ بێنن بە زمان دەری بڕین و بە کردار ئەنجامی بدەین )خۆ لێرە بە دواوە هەموو ئەو بەڵگانە دادەنێن کە ئەگەر بێتو لە هەر فەریزەیەک و نەهی لێ کراوێکدا یەک بەش لە سێ بەشەی ئیمان دەرکەین ئەوا ئیمانەکەمان باطل دەبێتەوە وە لای الله بەبێ باوەڕ حیساب دەکرێت پەنا بە الله کە دەیسەلمێنین بە وتەی الله تعالى لە کتێبە پیرۆزەکەی قورئان و سوونەتی رسول الله ﷺ و زانایانی ئەهلی سوونەت و جەماعە ان شاءالله. جا ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە باسی لێوە دەکەین بریتییە لە باوەڕ " الایمان" بە "الله"

ئاخۆ ئەوئیمانەی الله لەئێمەی ئەوێت ،دەبێت چۆن بێت بەرامبەری؟

## کۆمەڵێ دەستەواژەی عەرەبی بۆ کوردی:

الایمان > باوەڕ

قول > وتە

عمل > کردەوە

اعتقاد > بیرو باوەڕ

یزید > زیاد دەبێت

ینقص > کەم دەبێت

قلب > دڵ

اللسان > زمان

جوارح > ئەندامەکانی جەستە

عبادة > پەرستن

معاصي > تاوان

التصديق > بەڕاست دانان

الظاهر > دیوی دەرەوە ئاشکرا

الباطن >دیوی ناوەوە

## وانەی یەکەم

ئیمان قەول و عمل و اعتقادە زیاد دەبێت بەعیبادەتکردن و کەم دەکات بەتاوانکردن کەئیجماعی زانایانی سەلەفی لەسەرە کە إن شاءالله یەک بەیەک پێدادێین باسی دەکەین..

بەڵام بەداخەوە لە سەردەمی سەلەفەوە تا ئێستاش بەردەوام فیرەقی گومڕاو گومڕاکەر درووست بوونە کە چەواشەکاری و گۆڕانکاری لەم عەقیدە پاکەدا دەکەن لەوانە :

- خەڵکانێک هەن دەڵێن( ئیمان) تەنها "مەعریفەتە" تەنها ئەوەیە کە لەناو دڵدایە کە جەهمییەکانن و هەندێک لە مورجیئەکانیش.

- خەڵکانێکی تر دەڵێن ئیمان تەنها قەولی لیسانە واتا تەنها بە زمان بوترێت کە ئەمانیش فیرقەی "الكرامية"ن

- وە خەڵکانێکی تر هەن ئیمان لایئەوان بریتییە لە شوێنکەوتنی باوباپیرانیان کە ئەوەی لایئەوان نەمابێتەوە بە دین و ئیمانی نازانن.

خەڵکانێکی تر هەن کە دەڵێن ئیمان دل و زمانە پەیوەندی بە عەمەلەوە نیە کەئەمانیش مورجیئەی فوقەهان کە کۆمەڵێ فەقێ بوون کە کەوتبوونە ناو ئیرجائەوە کە دیارو زانراویشە ئە جیاوازییەی هەیە لە نێوان مورجیئەی فوقەهاو ئەهلی سوونەدا خیلافێکی حەقیقیە نەک خیلافێکی لفظي کە لە ڕاستیدا خەڵکانێکی زۆر لەم بوارەدا تێ کەوتوون

خەڵکانێک هەن کە ئیمان تەنها دەبەستنەوە بە شهادەت کە ئەگەر وتی( أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله)ئیتر بە ئیماندار حسێبە لای ئەوان تەنانەت ئەگەر کردەوەشی نەبێت

وە خەڵکانێکی تر هەن پێیان وایە ئیمان تەنها (قلب (دڵ) ە ئەگەر هیچ عەمەلێکیش نەکات ، هەتا بە زمانیش لای ئەوان ئیمان دارە،

وە خەڵکانێکی تر هەن ئیمان لای وان بریتییە لە تەرککردنی سیفەتی خوا ، واتە(بڵێت خوا سیفەتی نییەلای وان ئیمانداره)و (ئەوەی بڵێ خوا سیفەتی هەیە لای وان کافرە) کە ئەمەش اعتقادی (موعتەزیلەکان)ە ،پەنابەخوا.

- وە خەڵكانێك هەن ئیمان لای وان بریتییە لەو جۆرو شێوازە پەرستنەی كە زەوقی خۆیان وزەعمی خۆیاندەیانەوێ.

- خەڵكانێكی تر هەن ،كە ئیمان تەنها لایان باش ڕەفتاركردنە لەگەڵ خەڵكدا، ڕووخۆشییە لەگەڵ خەڵكدا،دەی ئەوە با بڵێم كە بەڵێ ئیسلام فرمان بەچاكەكاری دەدات لە مەسەلەی( معاملات) ئەی مەسەلەی(عیبادەت) چی؟ لە ئیسلامدا بەشێك بەناوی(الأحكام العملیة یان تشریعات العملیة)كە هەموو ئەو كردەوانە ئەگرێتەوە كەوا مرۆڤ ئەنجامیان ئەدات دوو جۆرن:

أ / (عیبادات )كە بریتییە لە كردەوەی نێوان مرۆڤەكان و الله تعالى

ب/ (معاملات)كە بریتیە لە كردەوەی نێوان مرۆڤەكان خۆیان لەوانە: كڕین و فرۆشتن، قەرز، زەواج و تەڵاق و سیلەی ڕەحم.......... هتد

وە بەشێكی تری ئیسلامیش بریتیە لە(بنەما ڕەوشتییەكان) و بنەما زۆر زۆر گرینگەكەش كە بەشی سێیەمی ئیسلامە (الأصول والأ عتقادات)ە، واتە بنچینەو بیروباوەڕ (العقیدە)كە ئەمە بنچینەی قبوڵبونی هەردوو

بەشەکەی تری ئیسلامە لە مبادئ خلقي تاک واتە ڕەوشتەئیسلامیەکان و معاملات ،کە ئیمان یش بابەتی عەقیدەیە کەدەبێ شارەزابین تیایدا نەک تەنها بڵێین کردەوەی چاک بکەی دەجیە بەهەشت! ئەگەرچی عەقیدەشت پووچ بێت پەنا بەالله تعالى.

وەخەڵکانێکی تر دەڵێن ئیمان (تەنها خۆدارِنینە لە دونیا و هتد .

وە خەڵکانێکی تر ئیمان یەک پارچە یان هەموو نامێنێت بەهۆی تاوانێک جا چ دەرکەربێ لەبازنەی ئیسلام یان دەرکەر نەبێ یان هەمووی هەیە بەهۆی بێتاوانی.

وە هەموو ئەوانەی باسمان کردن حەقیقەتی ئیمان ناناسن لە کاتێکدا کە کە ئایەت و حەدیث بنۆڕین دەبینین کە حەقیقەتی ئیمان بریتییە لە (قول و عمل و نیەت) ڕێبازی ئەهلی سوونە دۆستایەتی و دژایەتیمان في سبیل الله بێت وە بەخشین و گرتنەوەت في سبیل الله بێت کە بێ گومان ڕێگای ئەو ئیمانەش بریتییە لە خۆ دارِنینمان لە ڕێبازی غیر رسول الله ﷺ وە چاو داخستنمان لە ئاست هەموو مەتبوعەکانی تر غەیری مەتبوعی حەق نەبێت کە رسول الله یە ﷺ..

**تێبینی/** امام ابي بكر عبدالله بن زبير حميدي له (اصول السنة) کەیدا دەفەرموێت: **(و لا ينفع قول الا بعمل و لا عمل و لا قول الا بنية ولا قول و لا عمل و لا نية الا بسنة)**

واتە ئەگەر قەولیشمان هەبێت نموونە بڵێین (من باوەڕم بە نوێژە کە واجبە) ئەو قەولە هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێت ئیلا کاتێک عەمەلی لەگەڵە (واتا ئیلا دەبێت نوێژەکەش بکەی) ئەمجارە نوێژەکەش سوودت پێ ناگەیەنێت مەتا نییەتێکی پاکی لەگەڵدا نەبێت وە دووبارە هیچ کام لەمانە سودت پێ ناگەیەنێت مەتا لەسەر سوونەتی رسول الله ﷺ نەبێت، کە لێرەدا .ئیمان .دوو رووکنەکەی قەبووڵبوونی دوعامان پێ دەڵێت کە هەر عیبادەتێکی فەرزو سوننەت هەیە ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبێت الله قەبوڵی ناکات کە بریتین لە الإخلاص و متابعة واتە دەبێت نییەتت تەنها بۆ الله تعالى بێت لەو کارە وە کارەکە لەسەر سوننەتی رسول الله ﷺ بێت ئەوجا لای الله مەقبولە ان شاءالله..

## وانەی دووەم:

ئێمە وەکو ئەهلی سوونەو جەماعە دەڵێین: ئیمان بریتییە لە :

-- (قەول لە ظاهر و باطن)

--(عەمەل لە ظاهر و لە باطن )

-- (ئیمان زیاد دەکات بە عیبادەتکردن وە کەم دەکات بە تاوان کردن)

١/قەول لە ظاهر و لە باطن چیە؟؟؟؟

٢/عەمەل لە ظاهر و لە باطن چیە؟؟

## وەڵام:

١/قەول

لە ظاهر: واتە: وتەی زمان چونکە خەڵک دەیبیستێ دیارە لێوەی (قول اللسان)

لە  باطن: واتا وتە ی دڵ کە خەڵک ناتوانێت بیبیستێت و هەستی پێ بکات بە هیچ کام لە هەستەوەرەکان نەک بە دڵ  (قول القلب)

٢/عمل

لە ظاهر: واتا کارکردن بە ئەندامەکانی جەستە کە لە موسڵمانان دیارن

لە باطن: واتا کاری دڵ و کردەوەکانی دڵ کە لە خەڵکییەوە دیار نین

## وانەی سێیەم

بەڵگەکان لە قورئان و سوننەت:

١/بەڵگە لەسەر قول القلب

کە برتییە لە (التصدیق: بەڕاست دانان لەدڵدا + الیقین: بریتێە لە دڵنیای تەواو لەبوونی ئەوشتە):

أ/ خوای گەورە فەرموویەتی: **(أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ)**[١]

-ابن جرير الطبري لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (و اخبرة تعالى ذكره **انه كتب في قلوبهم الايمان لهم و ذلك لما كان الايمان بالقلوب و كان معلوما بالخبر عن القلوب ان المراد به اهلها اجتزئ بذكرها من ذكر اهلها)**

[١] - المجادلة ٢٢

-ابو محمد حسين البغوي لە تەفسیرەکەی بۆ ئەم ئایەتە فەرموویەتی:

(**اثبت التصديق** في قلوبهم فهي موقنة موخلصة)

-امام القرطبي لە تەفسیری ئەم ئایەتە فەرموویەتی:

(اولئك كتب في قلوبهم الايمان أي: **خلق في قلوبهم التصديق** يعني من لم يوال من حاد الله)

-امام ابن كثير لە تەفسیرەکەی فەرموویەتی:

(اولئك **كتب في قلوبهم الايمان** و ايَّدَهُم بروح منه)أي:من اتصف بأنه لا يواد من حاد الله و رسوله ولو كان أباه أو أخاه فهذا ممن كتب الله في قلبه الايمان أي: كتب له **السعادة** و **قررها** في قلبه و **زين الايمان** في بصيرته)

ب/

-پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیمان فەرموویەتی:

(ان تؤمن بالله و ملائكته وكتبه ورسوله واليوم الاخروان تؤمن بالقدر خيره و شره)[٢]

-وە پێغەمبەر ﷺ لە حديثي شەفاعەتدا فەرموویەتی:

(فأقول يارب امتي امتي فيقول انطلق فاخرج من كان في قلبه ادنى ادنى ميثقال الحبة خردل من الايمان فاخرجه من النارفأنطلق)[٣]

ئەوانەی باسمان کردن لەم دوو حەدیثە هەموو بریتین لە بیرو باوەڕێک (قەولێک) کە لە دڵدا جێگیربوون.

---

[٢] - (رواه مسليم ٨) (رواه بخاري ٥٠)

[٣] - رواه مسلم(١٩٣) رواه البخاري (٧٥١٠)

## ٢/بەڵگە لەسەر (قول اللسان)

أ/ الله تعالى فەرموویەتی: ( قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ )[٤] واتە: (ئەی پەیڕەوانی محمد ﷺ ئێوە) بڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا هێناوەو بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان و بەوەش کە دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب، هەروەها بەو پەیامەی کە بۆ موساو عیسا هاتووە و بەو پەیامانەی کە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانەدا، **ئێمە هەموومان تەنها تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارین(واتە موسڵمان بۆین و پێی داخل ئیسلام بوونە).**

---

[٤] - البَقَرَة : ١٤٣

**تێبینی/** ببینە لێرەدا بە قەول(وتە)داخڵی ئیسلام بوون کە بەشێکی جیانەکراوەی ئیمانە.

ب/ عن ابن عباس قال: أتى رسول الله ﷺ نَفرٌمن يهود، فيهم أبو ياسر بن أخطب، ورافع بن أبي رافع، وعازر، وخالد، وزيد، وأزار بن أبي أزار، وأشْيَع, فسألوه عمن يؤمن به من الرسل فقال: أومن بالله وَمَا أنزلَ إلينا وما أنزلَ إلى إبرَاهيمَ وإسماعيل وإسحاقَ ويعقوب والأسباط, ومَا أوتي مُوسى وعيسى وَمَا أوتي النبيون من رَبهم لا نُفرّق بين أحد منهم ونحن له مُسلمون. فلما ذكر عيسى جحدوا نبوته، **وقالوا: لا نؤمن بعيسى, ولا نؤمن بمن آمن به**. فأنزل الله فيهم: قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنْقِمُونَ مِنَّا إِلا أَنْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ)[٥]

ئەو ئەثەرە لە ابن عەباسەوە وەرگیراوە کە جولەکەکان ئیماندار نەبوون چونکە بە رسول الله ﷺ یان دەوت **(لا نؤمن بعيسى ولا**

[٥] -[جامع البيان عن تأويل القرآن]رقم:٢٠٩٥

نؤمن بمن امن به)،ئیمان به عیسا ناهێنین جا الله تعالی ئایەتی ٥٩ی سوره تي المائدة ی دابەزاند و قسه ی پێ وتن به کافرێکی فاسق ناویبردن، چونکه بەس به قەول ەکه که ئیمانیان نەهێنا ،الله بەکافری فاسق ناوی بردن..

چونکه ڕونه کەتۆ ئیمان بێنی دەبێت ئیمانت بەهەموو پێغەمبەرانی الله هەبێت هەروەک حەدیثەکەی پێشەوە باسمان کرد: (ان تؤمن بالله و ملائکته وکتبه ورسوله والیوم الاخر وان تؤمن بالقدر خیره و شره)

ب/ پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: (لمرت أن اقاتل الناس حتی یقولوا لا اله الا الله فمن قال لا اله الی الله فقد عصم مني نفسه و ماله الا بحقِّه و و حیسابُهُ على الله)[٦]

---

[٦] -(رواه مسلم ٢١) (روا البخاری ٢٩٤٦)

لێرەدا رسول الله ﷺ: دەفەرمووێ: کە ئەمرم پێکراوە کوشتاری خەڵک بکەم تائەوکاتەی دەڵێن: لا الە الا اللە محمد رسول اللە.....

ب/ وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الایمان بضعٌ وسبعون -یان- بضعٌ و ستون شعبة فأفضلها قول لا اله الا الله و ادناها إماطة الأذى عنِ الطريق، والحياء شعبة من الايمان)[7]

لێرەدا رسول الله ﷺ فەرمویەتی: کە ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشە یان شەست وئەوەندە بەشە کە بەرزترینیان وتنی : لا الە الا اللە یە...

تێبینی/ دەڵێم بەڕاستي بەڵگەکان زۆر ڕوونن هەرکەسێ وەری نەگرێت ئەوا دڵی نەخۆشە و ئەبێت دوعای هیدایەتدان بکات...

## ٣/ بەڵگە کەسەر (عمل قەلب) کردەوەی دڵ:

[7] -(مسلم ٣٥) (البخاري ٩)

کە برتییە لە (الاخلاص) نیەت پاکی (انقیاد) و (الخوف)ترسان لە سزای خوا )الرجاء)ئومێدبوون بە ڕەحمەتی خوا وە (المحبة) خۆشویستنی اللە

أ/ خوای گەورە فەرموویەتی: {إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ (٢)ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ(٣)أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (٤)}[٨]

لە تەفسیری ئەم ئایەتە ابن عەباس (رضي الله عنه) فەرموویەتی:

(إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ) قال :المنافقون لا يدخل قلوبهم شيء من ذكر الله عند اداء فرائضه و لا يؤمنون شيء من أيات الله و **لا يتوكلون على الله** ولا يصلون اذا غابو و لا يؤدون زكاة أموالهم **فأخبر الله سبحانه انهم ليسوا بالمؤمنين**)

---

[٨] - الأنفال ٢-٤

**تێبینی/** دیقەتبەن لەبەرئەوەی پشتیان بە خوا نەبەستووەکە یەکێکە لەو خاڵانەی ئیبن عەباس(رضي الله عنه)باسی کردووە و **عەمەلێکی دڵە** بەس بەمە خودای گەورە ناووی بردوون بەوەی کە بە دڵنییایەوە ئیماندار نین هەر وەک ابن عباس رضي الله لە خۆی و باوکی بێت ڕوونی کردەوە.

ب/ هەر لەم حەدیسە کە لە پێشەوە لە بابەتی (قول للسان )باسمان کردهەمان حدیث دەبێتە بەڵگە بۆ (عمل قلب) لەبەر ئەوەی باسی (الحیاء) دەکات کەبەشێکە لەئیمان، (حیاء )یش عەمەل و کردەوەی دڵە.[9]

وە تەنانەت بەڵگەی( عمل بالجوارح) تێدایە چونکە باسی لابردنی شت دەکات لەسەر ڕێگای ئیمانداران کە ئەمەش عەمەلە بە ئەندامەکانی جەستە.

---

[9] - رواه مسلم (٣٥) رواه البخاري(٩)

## ٤/بەڵگە لەسەر (عمل بالجوارح):

کە (پاک و خاوێنی) (نوێژو ڕۆژو) (حەجکردن) و (جیهاد) و غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە.

أ/ اللە تعالى فەرموویەتی: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ **وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ** ۚ وَذَٰلِكَ **دِينُ الْقَيِّمَةِ**)[١٠]

لێرەدا اللە بەکردنی نویژ و دانی زەکات دەڵێت دینی ڕاست،کە دوو کارن بە ئەندامەکانی جەستە دەکرێن...

- اللە تعالى فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا **وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ** وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ **هُمُ الصَّادِقُونَ**)[١١]

---

[١٠] - البينة(٥)

[١١] -( الحجرات ١٥)

لێرەدا (الجهاد من عمل الجوارح) کە بیکات، الله ئیمانەکەی پێ بەراست خستۆتەوە ،پێچەوانەی مونافقەکان کەخۆیان دەدزنەوە لەجیهاد

-خوای گەورە فەرموویەتی: {إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ (٢) ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ(٣)أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (٤)}[١٢]

لێرەدا الله تعالی لە دوای گۆڕینی قیبلە کە پێشتر موسڵمانان ڕووەو بیت المقدس نوێژیان دەکرد دواتر قیبلەکەی گۆڕی بۆ بیت الحرام مککە ئەوجا الله تعالی هەواڵیان پێ دەدات کە ئەو نوێژانەی کە ڕووەو بیت المقدس کردوویانە نافەوتێن و لای الله تعالی حیسابە، جا دیقەت بدە الله تعالی ناوی کردەوەی نوێژ بە ئیمان ناودەبات و دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْۚ) واتا الله نوێژەکانتان نافەوتێنێت

---

[١٢] - الأنفال ٢-٤

جا هەر بۆیەش امام البخاري(رحمه الله) له صحيحه کەیدا بابێکی هەیە بە ناوی (باب الصلاة من الايمان)

ب/پێغەمبەری الله ﷺ بۆ وەفدی عبدالقيس :

**(امركم بالايمان بالله وهل تدرون ماالإيمان باالله شهادة ان لا اله الا الله و اقام صلاة و ايتاء زكاة وتُعطوا من المغنَمِ الخُمُس)**[١٣]

ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت کە ئیمان برتییە لە: دوو شەمادەکە نوێژکردن و زەکاتدان و هتد

(و لله حمد والمنه زۆر ڕوونن)

---

[١٣] - (رواه مسلم ١٧)(رواه البخاري ٧٥٥٦)

## وانەی چوار

لە پێشەوە وتمان كە اعتقادی ئەهلی سوننە وایە كە ئیمان زیاد دەكات بە طاعەتی الله ،وە كەم دەكات بەتاوان .

بەڵگەكان:

-الله تعالی فەرمویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ **زَادَتْهُمْ إِيمَانًا**)[14]

-وەفەرمویەتی: (**وَيَزِيدُ** اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى)[15]

وەفەرمویەتی: (**ويزداد** الذين آمنوا ايمانا)[16]

---

[14] - **الانفال -٢-**

[15] - مريم -٧٦-

[16] - المدثر-٣١-

-وه فەرمویەتی: (هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ **لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا** مَّعَ إِيمَانِهِمْ)[17]

-وه فەرمویەتی: (الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ **فَزَادَهُمْ إِيمَانًا** وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)[18]

-وه فەرمویەتی: (وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ **زَادَتْهُ هَٰذِهِ إِيمَانًا**ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا **فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا** وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ، وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ)[19]

(بەڵگەی زورمان هەیە لەسوننەت بەڵام ئەوەی سەرەوە کیفایەتە و زۆر زۆر ڕونە ).

[17] - الفتح-٤-

[18] - ال عمران-١٧٣-

[19] - التوبه-١٢٤-١٢٥-

## وانەی پێنجەم

ڕوونکردنەوەیەک سەبارەت بە ئیمان

١-ئەصلی ئیمان

٢-ئیمانی واجب

٣-ئیمانی موستەحەب

**١-ئەصڵی ئیمان:** ئەم جورە ئیمانە زیاتر پەیوەندی بە کوفرو شیرکەوە هەیە، هەموو قەولو وتەیەک یان کردەوەیەک دەگرێتەوە کەتەرک کردنی کوفر بێت، ئەنجامدانی ئەصلی ئیمانە، وە هەموو قەولو فعلێک دەگرێتەوە کە ئەنجامدانی کوفر بێت، وە تەرک کردنو واز لێهێنانی ئەصلی ئیمانە، هەر وتەو کردەوەیەک کە کوفر بێت دەبێت تۆ ئیمانت بەوە هەبێت کە کوفرەو نابێت ئەنجام بدرێت، ئەگەر تۆ کردارێکی کوفریت پێ کوفر نەبێت خۆت کافر دەبیت، یان وتەیەکی کوفریت پێ کوفر نەبێت خوت کافر دەبیت.

-نمونە لەسەر وتەو کردارێک کە ئەنجامی نەدەیت کافری، وە ئەنجامدانو وتنی ئەصلی ئیمانە:

قول/ تەرککردن و نەگوتنی کەلمەی تەوحید (لاالە الاالله)کوفرەو وتنیشی ئەصلی ئیمانە

عمل/ تەرککردنی نوێژ کوفرە و ئەنجامدانی ئەصلی ئیمانە.

-نموونە: لەسەر وتەو کردەوەیەک کە ئەگەر بیڵێی یان ئەنجامی بدەی پێی کافر دەبیت وە تەرک کردنی ئەصلی ئیمانە:

قول: جنێودان بە الله تعلى کوفرە تەرککردنو نەوتنی ئەصلی ئیمانە .

عمل: سوجدە بردن بۆ بت و حەیوان سەربڕین بۆ جگە لە الله تعالى کوفرە نەکردنیان ئەصلی ئیمانە .

**تێبینی/** جا هەر کەسێک ئەصلی ئیمانی هەبێت ان شاءالله دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەرچی کەمو کورتیشی لە ئیمانی واجب هەبێت ،وە هەر کەسێک ئەصلی ئیمانی نەبێت پێی ناگوترێت مسوڵمان ئەگەر ئیمانی واجبیشی هەبێت .

**٢. ئیمانی واجب:** ئەم ئیمانە پاش ئەصلی ئیمان دێت و پەیوەندی بە حەڕام و حەڵاڵەوە هەیە، دەبێتە هۆی زیادبونی ئەصڵی ئیمان ، هەموو کارێک دەگرێتەوە کە تەرککردنی حەڕام بێت، ئەنجامدانیشی ئیمانی واجبە، وە هەموو کردارێک دەگرێتەوە ئەنجامدانی حەڕام بێت، تەرککردنی لە ئیمانی واجبە.

- نموونە: لەسەر هەر عەمەلێک کە وازهێنان لێی حەڕامە و ئەنجامدانی ئیمانی واجبە، وەکو: چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک و جیهاد و ئەمانەت پارێزی و...هتد.

- نموونە: لەسەر هەر عەمەلێک کە ئەنجامدانی حەڕام بێت و تەرککردنی لە ئیمانی واجبە

وەک: تۆ با زیناش نەکەی ئەبێ ئیمانت بەوە هەبێ کە حەڕامە، وە دزی کردن و عارەق خواردنەوە و ڕیبا و...هتد

### ٣.ئیمانی موستەحەب:

ئەمەش پاش ئەصڵی ئیمان و ئیمانی واجب دێت ، دەبێتە هۆی ئیمانی زیادبونی ئیمانی واجب، ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کە مەکرۆهن، هەر کردەوەیەک تەرککردنی مەکروهـ بێت ئەنجامدانی لە ئیمانی موستەحەبە، وە هەر کردەوەیەک ئەمجامدانی مەکرۆهـ بێت تەرککردنی لە ئیمانی موستەحەبە.

- نموونە: سیواککردن تەرککردنی مەکروهە، ئەنجامدانی لە ئیمانی موستەحەبە.

**تێبینی/** کەواتە ڕوون بویەوە کە (ئەصڵی ئیمان) پەیوەندی بە کوفر و ئیمانەوە هەیە

و( ئیمانی واجب) پەیوەندی بە واجبەکان و حەڕامکراوەکان هەیە و

(ئیمانی موستەحەب)یش پەیوەندی بە موستەحەبات و شتە مەکڕوهەکان هەیە.

جا هەر کەسێک (ئەصڵی ئیمان)ی هەبێت، ئەوە موسڵمانە و دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەرچی لە ئیمانی واجب و ئیمانی موستەحەب کەموکوڕی هەبێت، بەڵام هەرکەسێک ئەصڵی ئیمانی نەبێت موسڵمان نییە ئەگەرچی ئیمانی واجب و موستەحەبیشی هەبێت.

## وانەی شەشەم

(بەڵگەكان لەسەر ئیمان لەلایەن زانایانەوە)

١/ قاعیدە و بنەمایەكی نەبەوی كە نێوان ظاهر و باطن بەیەكەوە ئەبەستێتەوە لە شەریعەتی ئیسلامدا:

رسول الله ﷺ فەرمووی: **(ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْغة إذا صلحتْ صلح الجسد كله، وإذا فسدتْ فسد الجسد كله ألا وهيَ القلب).**

واتە: وریابن كە لە لاشەی هەریەك لە ئێوەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە چاك و باش بێت، ئەوا هەموو لاشەی ئەو ئینسانە باش ئەبێت، ئەگەریش ئەو پارچە گۆشتە خراپ بێت ئەوا هەموو لاشەی ئەو ئینسانە خراپ ئەبێت، ئاگاداربن و بزانن ئەو پارچە گۆشتەش دڵە.

**تێبینی/** لەم قاعیدە نەبەوییەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ظاهری ئینسان تابع و پەیوەستی باطن و ناخیەتی، هەروەک چۆن ئیمام (ابن تیمیة) لە تەعلیقی بۆ ئەم حەدیثە دەفەرمووێت: (ئیمان قەول و عەمەلە، قەولیش لە باطن و ظاهیردایە، وە عەمەلیش لە باطن و ظاهیردایە، وە ظاهیری ئینسان تابع و شوێنکەوتە و پەیوەستی باطن و ناخیەتی، هەرکاتێ باطنی ئینسان چاک بێت ظاهیریشی چاک دەبێت، وە ئەگەر خراپ بوو ئەوا ظاهیریشی خراپ دەبێت، هەربۆیە یەکێک لە هاوەڵەکان بە کەسێکی ووت: ئەگەر دڵی ئەو کەسە خاشع و ملکەچ بووایە بۆ الله، لاشەشی خاشع و ملکەچ ئەبوو).

جا ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم وتەیەی الله تعالی کە لەبارەی إکراه فەرموویەتی: **(إلا مَن أكره وقلبه مطمئن بالإيمان).**

الله ئیستثنائی دڵی کردووە کە نابێت لەکاتی ئیکراهدا دڵ ئارام بێت بە کوفر، چونکە بەردەوام بوون لە کوفر مانای ئەوەیە دڵت پێی ئارامە و لە دڵەوە کوفرت هەڵبژاردووە، بۆیە بە ئەندامەکانی لاشەشت موصیری لەسەر کوفر.

ئیمامی ابن بطه رحمه الله تعالى فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەرتانداخۆتان بپارێزن لە دانیشتن لەگەل کەمانێک کەوا لەدین دەرچوونە ،کە نکولی قورئانیان کردووە پێچەوانەی پێغەمبەریشیان کردووە لە ئیجماعی زانایانیش دەرچوونە.

ئەوانیش کەسانێکن کە ئەڵێن :

أ/ئیمان تەنها قەولە بەبێ کردەوە

ب/ ئەڵێن خوای گەورە چەند فەرزێکی لەسەر بەندەکانی فەرز کردووە وە خوای گەورە ئەمجامدانی ئەو فەرزانەی نەویستوە لە بەندەکانی هیچ زیانێکیان پێ ناگات ئەگەر تەرکی بکەن و ئەنجامی نەدەن، وە ئەڵێن خوای گەورە چەند شتێکیشی لەسەر بەندەکانی حەرام کردووە ئیماندارن ئەگەر چی ئەنجامیشی بدەن، ئیمان بەلایانەوە تەنیا بریتیە لەوەی دان بنێن بە واجبیەتی فەرزەکان با وازیشی لێ بێنن وە حەرام کراوەکان بناسن هەرچەندە بە حەلالیشی دابنێن.

ج/ هەروەها دەڵێن ناسینی خوا ئەو ئیمانەیە کە هیچ پێوسیت بە گوێڕایەڵی کردنی ناکات بۆیە هەرکەسێک لە دڵەوە خوا بناسێ ئەو کەسە ئیمانداراه مرۆڤی ئیماندار ئەو کەسەیە کە بەزمانی دەرئەبڕێ و بەدڵیشی زانایە پێی ئەوە ئیماندارێکی کامل ئیمانە وەک ئیمانی جبریل.

د/ وە ئیمان پلە ناکرێت نە زیاد دەکات و نە کەم دەکات

ه/هیچ یەکێک فەزڵی بە سەر یەکێکی تردا نیە موجتەهیدێک و گوێڕایەڵیکارێک و تاوانبارێک هەموویان وەکو یەکن، هەموو ئەمانە کوفر و ضەلالەتن هەلگری ئەم فکرەیە دەرچووە لە شەریعەتی ئیسلام خوای گەورە خاوەنی ئەو قسانەی تەکفیر کردووە لە کتێبکەی و پێغەمبەریش لە سوونەتەکەی و زانایانیش بە ئیتیفاقەکەیان.[٢٠]

---

[٢٠] -[الابانە الکبرى ٢/٨٩٣]

٣/ئیمامی ئیسحاقی کوری راهویه دەفەرموێ: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەرکەسێک شتێک لابەرێ ودوور بخاتەوە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسە کافرە هەرچەندە ئیقراریش بکات بەوەی کە خوا دایبەزاندووە.[٢١]

٤/أبو ثور رحمه الله دەفەرموێت: هەر کەسێک بڵێ من ئیقرار ئەکەم و دان ئەنێم بە کردەوەکە بەلام ئەنجامی نادەم ئەوا ئێمەش بەو کەسە ناڵێین ئیماندار.

٥/التستری( ئیمامی سهل بن عبدالله التستری ت ٢٨٣ ه) فەرموویەتی:

ئیمان ئەگەر تەنها قەول بێ بەبێ کردەوە ئەوا ئەوکەسە کافرە.[٢٢]

---

[٢١] -[التمهید ابن عبدالبر]

[٢٢] - الابانه ابن بطه ٨١٤/٢

٦/المروزی لەبارەی ئیبلیس ەوە فەرموویەتی: مەگەر کوفری ئیبلیس تەنها تەرک کردنی یەک سوجدە نەبوو کە خوا فەرمانی پێکرد بەلام ئەو قبوولی ئەو ئەمرەی خوای گەورەی نەکرد.[٢٣]

٧/ابن تیمیه رحمه الله دەفەرموێت: کوفری ئیبلیس و فیرعەون یەهود و هاوشێوەکانیان لە ئەصڵدا بریتی نەبوو لەوەی کە تصدیق وبەراست دانانیان نەبێت، وەک چۆن ئیبلیس خوا فەرمانی پێکردکە سوجدە ببات بەلام قبولی نەکرد کە سوجدە ببات و خۆی بەگەورە زانی بەو هۆیەوە چوە ریزی کافران جا کوفرەکەی بریتی بوو لە إباء و خۆ بەگەورە زانین نەوەک لەبەر تکذیب کردن و بەدرۆخستەنەوەی فرمانەکەی خوای گەورە بێت.

---

[٢٣] - تعظیم قدر الصلاه

٨/ابن قیم رحمه الله له کتێبی [عدة الصابرين:١٤١] دەفەرموێت:

هەرکەسێک ئیمان بناسێ لە دڵیەوە وە بەزمانیش دانی پێدا بنێ ئەوە تەنها بەمە نابێیە ئیماندار هەتاوەکو إنقیاد نەکات و ملکەچ نەبێ بۆ شوێن کەوتن و گوێرایەڵی کردنی رسول الله ﷺ وەپابەند بێت بە شەریعەتی ئیسلام بە ظهر و باطن دا.

٩/إبن قیم فەرموویەتی: هەر کەسێک سەرنجی سیرە و خەبەرە چەسپاوەکانی پێغەمبەری دابێت ﷺ لە شایەتی دانی زۆرێک لە موشریکەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ بەلام ئەم شایەتی دانە ئەوانی نەهێناوەتەوە ناو ئیسلام، بۆیە لەمەوە ئەزانێت کە ئیسلامەتی تەنها ئەوەندە نیە چونکە ئیسلامەتی تەنها ناسینی و ئیقرار پێکردنی نیە بەلکو ناسین و إقرار و إنقیاد و إلتزام بوونە بۆ دین و گوێرایەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە ظاهر و باطندا.[٢٤] وە ئەشمان بۆ دەردەکەوێ لە بەسەرهاتی دوو زانا جولەکەکە لەگەل پێغەمبەر ﷺ کاتێک چەند

---

[٢٤] - زاد الاعاد

پرسیارێکیان لێ کرد و پێغەمبەریش ﷺ وەلامی دانەوە و ئەوانیش وتیان: شاهیدی ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری، پێغەمبەریش ﷺ پێیانی فەرموو: ئەی چ رێگرە لەوەی کە شوێنم بکەون ئەوانیش وتیان: ئەترسین کە جولەکەکان بمان کوژن.[٢٥]

**تێبینی/**جا ئەو ناسین و شایەتی دانە ئەوانی نەهێنایە ناو ئیسلام چونکە ئیمتناعیان کرد و ئامادە نەبون کە شوێنی پێغەمبەر بکەون و ملکەچ بن بۆ دین.

١٠/إمام إبن تیمیە رحمە الله فەرموویەتی: نەفی ئیمان( واتە بێ ئیمانە) لە هەر کەسێک کراوە کە پشت ئەکات لە کردەوەیەک هەرچەندە بە زمانیشی دانی پێدا بنێ کە قبوولیەتی .

٢٥ -( رواه أحمد و النسائی و الترمذي)

١١/ وەلە[ فتاوی] إبن تیمیە فەرموویەتی :

مرۆڤ نابێتە ئیماندار ئیلا بە التزام کردنی نەبێ بە عەمەل لەگەڵ إقرار پێ کردنی خۆ ئەگەر تەنیا دانی پێدا بنێ بەلام إلتزام بە عەمەل نەکات ئەوا نابێتە ئیماندار ئەوکەسە.

١٢/وە هەر لە[ فتاوی] فەرموویەتی: هەرکاتێک ئەگەر یەکێک لە زانایان فەرمووبێتی ئەوکەسە تەکفیر ناکرێ ئیلا ئەگەر نکۆڵی واجب بونەکەی بکات. ئەوا جحد و نکۆڵی کردن لەلایەن ئەو زانایە بریتیە لە:

-تکذیب کردنی واجبەکە

-دان پێدانەنانی واجبەکە

-پەبەندنەبوونی واجبەکە

١٣/وەلە كتێبی[ المناهج] فەرموویەتی: هەركەسێك پابەندی حوكمی اللّٰه تعالی و پێغەمبەرەكەی نەبێت ﷺ ئەوا خوای گەورە سوێندی بەخۆی خواردووە كەوا ئەوكەسە ئیماندار نیە بەلام هەركەسێك پابەندی حوكمی خوای گەورە و پێغەمبەر بێ لە ظاهر و باطن بەلام سەرپێچی تێدا كرد و شوێنی هەواو ئارەزووی كەوت ئەوا لە ریزی تاوانبارەكانیەتی لە تاوانباران.

**تێبینی:** لە كتێبی[حوكم نەكردن بەقورئان ی ابو سیوف و كۆچەری رێی باوەر]ئاماژەمان بەوە كردووە كە مەبەست چیە لەو جۆرە حوكم نەكردنەی كە تنیا پێی تاوانبارە ،نەوەك بلێین تبدیل و تعطیل لە حوكمدا تەنیا تاوانباربونە،نەخێر كوفری گۆرینی حوكمەكان یان پەكخستن و كارپێنەكردن بە موطلەقی كوفری گەورەن و دەركەرن لە ئیسلام.

١٤/وە لە کتێبی[ الصارم المسلول]فەرموویەتی: گەر بەندە باوەری وابوو کەوا یەکێک لەو تاوانانەی خوای گەورە حەرامی کردووەئەو پێی وابوو خوا حەرامی نەکردووەیان پێی وابوو حەرامی کردووە بەلام إمتناعی کرد و ئامادەنەبوو قبولی ئەم حەرامە بکات وە گوێرایەڵی خوای گەورەی نەکرد لەم کارەدا ئەوا ئەوکەسە یان جاحدە یان موعانیدە ئەو کەسەش زۆر خراپترە لە کەسانی پێش خۆی.

١٥/إمام إبن بطه رحمه الله لە[ الإبانة] فەرموویەتی: هەکەسێک بانگەشەی ئەوەبکات کەوا دان ئەنێت بە فەرزەکان بەلام ئەنجامی نادات و تەرکی ئەکات،وە دان ئەنێت بە حەڕامبوونی فاحیشە و تاوانەکان بەلام لێی دوور ناکەوێتەوە وازی لێ نەئەهێنا(بەهەمیشەی). لەگەل ئەمەشدا ئیماندارە ئەوا تکذیبی قورئان و ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی کردووە وە نموونەی وەک نموونەی ئەو مونافیقەکانە، سەرەرای ئەوەی ئەو مونافیقەکان حالیان زۆر باشترە لە مورجیئەکان چونکە ئەوان ئینکاری ئەکەن بەلام ئەنجامی ئەدەن کەچی مورجیئەکان دان بە کردەوەکە ئەنێین بەزمانیان بەلام بە تەرک کردن و واز هێنان لێی ئینکاری ئەکەن.

١٦/وە إبن تیمیە رحِمَهُ‌اللَّه هەر لە [فتاوی] فەرموویەتی: هەر طائیفەیەکی مُمتنعة کە إمتناع ئەکات لەوەی کە پابەندی شەریعەت بێ لە شەرائیعی ظاهری متواتری ئیسلام ،لەو کۆمەڵەیە و غەیری ئەوانیش ئەوا واجبە قیتالیان لەگەڵ بکرێ تاوەکو پابەندی شەریعەتی ئیسلام ئەبن هەرچەندە دوو شایەتیدانەکەش بهێنن و پابەند بن بە هەندێکی شەریعەت، هەروەکو چۆن ئیمامی أبوبکری صدیق(رضي اللّٰه عنه ) شەر و قیتالی لەگەڵ مانعی زەکات (وازهێنەری زەکات دان) وە لەسەر ئەمەش إتفاقی زانایان هەیە .

١٧/ هەر لە[ فتاوی] فەرموویەتی: هاوەڵان و زانایانی دوای هاوەڵان یەکدەنگ بوون لەسەر قیتالی مانعی زەکات سەرەرای ئەوەش کە پێنج نوێژەکەیان ئەکرد و بەرۆژوو ئەبوون چونکە ئەوانە شوبهەیەکی روونیان نەبوو لەو بارەیەوە هەر بۆیە مرتد بوونە وە هاوەڵانیش قیتالیان کرد لەگەڵیان لەسەر إمتناع کردنیان لە پێدانی زەکات لە کاتێکدا ئیقراریشیان بە واجبەکە دائەنا.

تێبینی/ إمتناع واتە وازهێنان

١٨/ ابن القطان (رحمه الله) فەرموویەتی: گشتیان( واتە زانایانی سەلەف) ئیجماعیان هەیە و یەکدەنگ کەوا هەر لەو کاتەوەی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە وەحی نەماوە و پچراوە دینیش کامل بووە جێگیر بووە وەبۆ هیچ کەسێک حەلال نیە بەراو بۆچوونی خۆی شتێک لە دین زیاد بکات بەبێ ئیستیدلال کردن بە وەحی وە یان شتێکی لێ کەم بکاتەوە وە بەهیچ شێوەیەک حەلال نیە کەوا شتێک بخاتە جێگای شتێکی ترەوە تبدیلی بکات یان شەریعەت و بەرنامەیەک دابنێ هەرکەسێک لەو کارانەی ئەنجامدا ئەوا کافرە.[٢٦]

ولله الحمد والمنه

١٢ربیع الاول ١٤٤٥ ـ ٤:٥٣ بەیانی

اللهم صل وسلم على نبينا محمد وعلى اله محمد

---

٢٦ -[ كتاب الاقناع فی مسائل الاجماع]٤٨-٤٩/٩

## کۆتایی:

لە کۆتایدا وەک سەرەتاو هەمیشە سوپاسگوزاری الله م کە بەردەوام منی تاوانباری خستۆتە ژێر ڕەحمەتە فراوانەکەی خۆیەوە،کەهەتا مردن لەسوجدەی سوپاسگوزاریدا بم تەواو سوپاسم نەکردووە، وە دواتر سوپاسی یەک بەیەکی ئەو بەڕێزانە دەکەم گەر بەیەک وشەش یارمەتیدەرم بوونە،بە ئیزنی الله لەقیامەت بەچاوی خۆم دەیانبینم کە بەرەو بەهەشت ڕێدەکەن لەگەڵ هاوەڵانی رسول الله ﷺ...

الله تعالى بەنسیبی هەموو موسڵمانان بکات